# ژیاننامەی

# پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عليه وسلم

وەرگێڕاوە لە کتێبی (أمالي في السيرة النبوية)

شێخ : حافظ أحمد الحكمي رَحِمَهُ ٱللَّهُ



فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ

ئامادەکردنی

عثمان أحمد حاجم

# ژیاننامەی

# پێغەمبەری خودا ﷺ

وەرگێڕاوە لە کتێبی (أمالي في السيرة النبوية)

شێخ : حافظ أحمد الحكمي رحمه الله

ئامادەکردنی

عثمان أحمد جاسم

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اتبع هداه .

أما بعد :

پێغەمبەری خودا ﷺ سەرمەشقە بۆ هەموو موسڵمانێك ، وپێویستە شارەزای ژیاننامەیبن وپەند ووانەی لێ وەربگرن ، جێی داخە موسڵمان بە تایبەت چینی گەنجان ژیاننامە وورد ودرشتی ژیانی یاریزان وئەکتەر وسینەماکار وئابورییناس وسیاسەتمەدار وسەرۆکی وڵاتان بزانن ، بەڵام بێئاگابن لە ژیاننامەی پێغەمبەرەکەیان ﷺ .

ئەم نوسراوەی بەردەستتان لە کتێبی (أمالي في السيرة النبوية)ی شێخ (حافظ أحمد الحكمي رحمه الله) بە کەمێك دەستکارییەوە وەرمگێڕاوە ، کە بە شێوازی پرسیار ووەڵامە ، وبەکورتی دایڕشتووە ، کە سەرەتایەکی باشە بۆ شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، بەو هیوایەی توانیبێتم کەلێنێکم لەو بوارەدا پڕ کردبێتەوە .

عثمان أحمد حاتم

گەرمیان – کەلار

١٩ی شعبانی١٤٤٢ك

١ی نیسانی٢٠٢١

**بە ناوی خودای میهرەبانی بەبەزەیی**

**پ١ : ڕەچەڵەکی پێغەمبەری خودا ﷺ لە پشتەوە لەسەری باوکییەوە کێن؟.**

**و: ناوی محمد کوڕی عبداللە کوڕی عبدالمطلبی کوڕی هاشم کوڕی عبدمەناف کوڕی قوصی کوڕی کلاب کوڕی موڕە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالب کوڕی فیهر کوڕی مالك کوڕی نەزر کوڕی کینانە کوڕی خوزەیمە کوڕی مودرك کوڕی ئیلیاس کوڕی موزرکوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە .**

**پ٢ : ڕەچەڵەکی لە سکەوە لەسەری دایکییەوە کێن ؟ .**

**و: دایکی ناوی ئامینەی کچی وەهەب کوڕی عەبدمەناف کوڕی زهرە کوڕی موڕەیە ، وپێغەمبەری خودا ﷺ لە هاوسەرگیری نێوان عبداللەی باوکی وئامینەی دایکی لە دایك بووە ، وبە پەیوەندی ناشەرعی لە دایك نەبووە ، خودا ﷻ هەموو بابوباپیران ودایکانی لە داوێن پیسی پاراستووە.**

**پ٣: باوکی کەی وەفاتی کردووە ؟.**

و: باوكی لە مەدینە وەفاتی كردووە ، ئەو كاتە پێغەمبەری خودا ﷺ لە سكی دایكیدا بووە .

پ٤: كەی لە دایك بووە ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ لە ساڵی فیلدا لە دوازدەی ڕەبیعی یەكەم لە دایك بووە[(١)] .

پ٥: كێ جگە لە دایكی شیری پێداوە ؟.

و: دایكی ئەیمەن كەنیزەكی باوكی ، وثویبەی كەنیزەكی ئەبولەهەبی مامی ، پاشان لە "بنی سەعد" حەلیمەی كچی ئەبو ذویب شیریان پێداوە .

پ٦: كەی بەسەرهاتی شەقكردنی سنگی ڕوویداوە ؟.

---

(١) . ئیبن عوسەیمین ﵀ دەڵێت : جێگیر نەبووە كە پێغەمبەری خودا ﷺ لە دوازدەی ڕەبیعی یەكەم لە دایك بووە ، ولەو ڕۆژەدا لە دایك نەبووە ، بەڵكو هەندێك لە زانایانی فەلەك ناسی سەردەم دەڵێن : ڕۆژی نۆیەمی ڕەبیعی یەكەم لە دایك بووە .

و: کاتێك کە منداڵ بوو وتەمەنی نزیکەی چوار ساڵ بووە ، وبەرخ وکاری بۆ دایك وباوکە شیرییەکەی دەلـەوەڕاند ، ودوای ئەو ڕووداوە گەڕاندیانەوە بۆ لای دایکی .

پ٧: کەی دایکی مردووە ، وکێ دوای دایکی پەروەردەکردنی گرتووەتە ئەستۆ ؟.

و: تەمەنی شەش ساڵ بوو دایکی مرد لـە "ئەبواء" لـە نێوان مەککە ومەدینە ، لـە سەردانێك گەڕانەوە لای خاڵـەکانی لـە "بنو النجار" ، ودوای وەفاتی دایکی عبدالمطلبی باپیری سەرپەرشتی وپەروەردەکردنی گرتە ئەستۆ .

پ٨: کەی عبدالمطلبی باپیری وەفاتی کرد ، وکێ دوای ئەو پەروەردەکردنی گرتووەتە ئەستۆ ؟.

و: عبدالمطلبی باپیری کاتێك وەفاتی کرد تەمەنی هەشت ساڵ بوو ، ودوای وەفاتی باپیری ئەبوتالـبی مامی ئەرکی پەروەردەکردن وسەرپەرشتی گرتە ئەستۆ ، کە زۆر بەسۆز ومیهرەبان بوو بەرامبەری .

پ٩: کەی سەفەری کردووە لەگەڵ مامی بۆ وڵاتی شام ؟.

و: کاتێك تەمەنی دوازدە ساڵ بوو ، لەگەڵ مامی سەفەری شامی کرد ، بەحیرای راهیب بینی وبەڵگە ونیشانەکانی پێغەمبەرایەتی تێدا بەدی کرد ، وفەرمانی کرد بە مامی بیگەڕێنێتەوە بۆ مەککە .

پ١٠: کەی شەڕی "الفجار" ڕوویداوە ؟.

و: شەڕی "الفجار" کاتێك ڕوویداوە کە تەمەنی پێغەمبەری خودا ﷺ چواردە ساڵ بوو ، یارمەتی مامەکانی دەدا لە شەڕەکەدا وتیری دەدایە دەستیان .

پ١١: کەی بۆ جاری دووەم سەفەری وڵاتی شامی کردەوە ؟.

و: بۆ جاری دووەم سەفەری وڵاتی شامی کرد بۆ بازرگانی کردن بۆ خەدیجە لەگەڵ مەیسەرەی کۆیلەی خەدیجە ، ولە کاتی گەڕانەوەی خەدیجەی مارە کرد ، کە لەو کاتەدا تەمەنی بیست وپێنج ساڵ بوو .

پ١٢: کەی قورەیش کەعبەیان بونیات کردەوە ؟.

و: قورەیش کەعبەیان بونیات کردەوە کاتێك تەمەنی پێغەمبەری خودا ﷺ سی وپێنج ساڵ بوو ، وکردیان بە دادوەر کە کێ بەردە ڕەشەکە لە جێگای خۆی دابنێتەوە ، ئەویش خستیە سەر پۆشاکێك وفەرمانی کرد بە هەر تیرەیەك لایەکی پۆشاکەکە بە دەست بگرن ، کە چوار تیرە بوون ، کاتێك بەرزیان کردەوە بۆ شوێنەکەی خۆی بە دەستی خستیەوە شوێنەکەی خۆی .

پ١٣: پێغەمبەری خودا ﷺ تەمەنی چەند بوو کاتێك خودا ﷻ بە پێغەمبەر هەڵیبژارد ، وبۆ کێ ڕەوانەی کرد ؟.

و: خودا ﷻ لە تەمەنی چل ساڵیدا بە پێغەمبەر هەڵیبژارد ، وڕەوانەی کرد بۆ هەموو خەڵك ، بۆ ئەوەی مژدە بدات بەو کەسانەی باوەڕ دەهێنن وکردەوەی باش ئەنجام دەدەن ، وئەو کەسانە بترسێنێت کە خراپە ئەنجام دەدەن یان باوەڕ ناهێنن .

پ١٤: سەرەتای وەحی بەچی دەستی پێکرد ؟.

و: سەرەتا وەحی بە خەون بینینی باش دەستی پێکرد ، هیچ خەونێکی نەدەبینی ئیللا وەك گزنگی ڕۆژ ڕوون دەهاتە دی .

پ١٥: حاڵی چۆن بوو پێش ئەوەی وەحی بۆ دابەزێت ، ویەکەم شتێك کە بە وەحی بۆی دابەزی چی بوو ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ لە ئەشکەوتی حیراء چەندان شەو دەمایەوە پەرستشی خودای دەکرد ، وتوێشووی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو مانەوەیە ، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە رضي الله عنها ، ودیسان توێشووی دەبرد بۆ مانەوەی پەرستش لەو ئەشکەوتە ، هەتاکو جبریل عليه السلام هات بۆ لای کە لە ئەشکەوتی حیراء بوو .

پ١٦: یەکەم شتێك کە لە قورئان بەسەریدا دابەزی چی بوو ؟.

و: یەکەم شتێك کە لە قورئان دابەزی بەسەریدا ئەم ئایەتانە بوو : ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ۝٥﴾(العَلَق) ، پاشان دابەزینی وەحی خاوبوویەوە .

پ١٧: ماوەی خاوبوونەوەی وەحی چەند بوو ، ویەکەم ئایەتێك دوای ئەو ماوەیە بەسەریدا دابەزی چی بوو ؟.

و: ماوەی خاوبوونەوەی دابەزینی وەحی سێ ساڵ بووە ، وەك ئیبن ئیسحاق باسی دەکات ، دوای ئەو ماوەیە یەکەم ئایەت کە بۆی دابەزی ئایەتی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ١﴾(المُدَّثِّر) بوو ، پاشان سورەتی فاتیحە دابەزی ، پاشان دابەزینی وەحی گەرم بوویەوە ، وئایەتی تر بە دوایدا دابەزی .

پ١٨: کێ یەکەم کەس بوو باوەڕی بە پەیامەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا ؟.

و: یەکەم کەسێك کە لـە ئافرەتان باوەڕی پێهێنا خەدیجەی هاوسەری بوو رضي الله عنها ، ولـە پیاوە پیرەکان وەرەقەی کوڕی نەوفل رضي الله عنه بوو ، ولـە پیاوان ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه بوو ، ولـە مندالاّن عەلی کوڕی ئەبوتالب رضي الله عنه بوو ، ولـە مەوالییەکان زەیدی کوڕی حارسە رضي الله عنه بوو ، ولـە کۆیلـەکان بلال رضي الله عنه بوو ، وبە هۆی بانگەوازی ئەبوبەکرەوە : عوسمانی

کوڕی عەفان وعەبدالرحمانی کوڕی عەوف ، وسەعد ، وسەعید ، وئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﵃ وجگە لەوانیش باوەڕیان هێنا .

پ١٩: شێوازی بانگەوازی بۆ ئیسلام لە سەرەتادا چۆن بوو ؟.

و: بانگەواز یەکەمجار بە نهێنی بوو ، نزیکەی سێ ساڵ ، پاشان فەرمان بە پێغەمبەری خودا ﷺ کرا کە بانگەوازەکەی ئاشکرا بکات .

پ٢٠: کاتێك بانگەوازی ئاشکرا کرد لە کێوە دەستی پێکرد وبانگەوازی کردن ؟.

و: کاتێك ئایەتی : ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾(الشُّعَرَاء) دابەزی ، واتە : عەشیرەت وخزمە نزیکەکانت بترسێنە ؛ سەرکەوت بەسەر شاخی "ئەبوقوبەیس"دا ، بە گشتی وبە تایبەت قسەی بۆ کردن ، وفەرمووی : ئەی هۆزی قورەیش ، ئەی نەوەکانی عەبدمەناف ، وئەی نەوەکانی هاشم ، نەفسی خۆتان لە ئاگر ڕزگار بکەن وگوێڕایەڵی خودا بکەن ، من هیچم پێناکرێت بۆتان ، ئەی عەباسی کوڕی عبدالمطلب ، من لای خودا هیچم پێناکرێت بۆ تۆ ، وئەی صەفییەی پوری پێغەمبەری خودا ، لای خودا

هیچم پێناکرێت بۆ تۆ ، وئەی فاتمەی کچی محمد لە ماڵ وسامانم چیت پێویستە داوام لیّ بکە ، بەڵام لای خودا هیچم پێناکرێت بۆ تۆ .

پ٢١: دوای ئەوەی بانگەوازی ئاشکرا کرد حاڵی خۆی وباوەڕداران چۆن بوو ، لەگەڵ هاوبەش بڕیاردەران ؟.

و: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد هاوبەش بڕیاردەران زیاتر نارەحەتیان کرد وئەزیەت ومەینەتیاندا ، وهەروەها موسڵمانانیشیان لەگەڵدا ئەزیەتدا وتووشی مەینەتیان کردن ، هەتاکو ڕوخسەتیان پێدرا کۆچ بکەن بۆ لای نەجاشی لە حەبەشە ، نزیکەی هەشتا پیاو کۆچیان کرد ، هەندێکیان خێزان ومنداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیان برد .

پ٢٢: پێغەمبەری خودا ﷺ وخزمەکانی تووشی چی هەڵوێستێك بوونەوە لە لایەن هاوبەش بڕیاردەرانی قورەیشەوە ؟.

و: بەردەوام هاوبەش بڕیاردەران ئەزیەت ومەینەتی پێغەمبەری خودا ﷺ زیاتر دەکرد ، هەتاکو کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بیکوژن ، خودا ﷻ بە هۆی

ئەبوتالبی مامیەوە پاراستی ، کەسوکاری وهۆزەکەی کۆکردەوە ، "بنو هاشم" و"بنو المطلب " هەموویانی بە بێباوەڕ وباوەڕدارەوە کۆ کردەوە بۆ پاراستن وپارێزگاری لە پێغەمبەری خودا ﷺ ، وخۆیان فیداکرد بۆ پارێزگاری لێکردنی ، جگە لە ئەبولەهەبی مامی ، کە دژایەتی پێغەمبەری خودای ﷺ کرد ، وزیانبار وسەرلێشێواو بوو .

**پ٢٣**: هاوبەش بڕیاردەران کاردانەوەیان چی بوو کاتێك ئەوەیان بینی ؟.

**و**: کاتێك هاوبەش بڕیاردەران ئەو هەڵوێستەیان بینی کۆبوونەوە بڕیاریاندا هەموو جۆرە کڕین وفرۆشتن وتێکەڵاوی وقسەکردن وژن خواستن وسەودا ومامەڵەیەکیان لەگەڵ "بنو هاشم" و"بنو المطلب" قەدەغە کرد ، وبەیاننامەیەکیان لەو بارەیەوە نوسی وبەدیواری کەعبەدا هەڵیانواسی ، و"بنوهاشم" و"بنو المطلب " لە شیوی ئەبوتالب ، کۆبوونەوە ، وبەو شێوەیە هەموو جۆرە گەمارۆیەکیان خستە سەریان .

**پ٢٤**: کەی ئەو بەیاننامەیە هەڵوەشێنرایەوە ؟.

و: بەو شێوەیە سێ ساڵ بە گەمارۆ دراوی مانەوە ، هەتاکو هیشامی کوڕی عەمر ، وزوهێری کوڕی ئەبوئومەیە ، وموتعمی کوڕی عەدی ، وئەبوبوحتری کوڕی هیشام ، وزەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عبدالمطلب ، هەڵیانوەشاندەوە ، وبەیاننامەکە دڕێندرا وپارچە پارچە کرا ، وبینییان خۆرە "الأرضة" ئەوەی تێدا نوسرابوو دەربارەی پچڕانی سیلەی ڕەحم هەمووی خواردبوو ، جگە لە ناوی پیرۆزی "الله" وئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەری خودا ﷺ پێش ئەوەی پارچە پارچەی بکەن .

پ٢٥: لە کام ساڵدا ئەوە ڕوویدا ، وچی لەو ساڵەدا ڕوویدا ؟.

و: ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بوو ، لەم ساڵەدا خەدیجەی هاوسەری ، وئەبوتالبی مامی وەفاتیان کرد ، ولەم ساڵەدا سورەتی "النجم"ی خوێند ، وسوژدەی برد وهەموو موسڵمانان وهاوبەش بڕیاردەران سوژدەیان لەگەڵدا برد ، وئەو هاوەڵانەی کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە کاتێك ئەم هەواڵەیان بیست هەندێکیان گەڕانەوە بۆ شاری مەککە ، گومانیان وابوو کە هۆزی قورەیش موسڵمان بوون ، بەڵام واقع پێچەوانەی ئەوە بوو .

پ٢٦: کەی ئیسراء ومیعراج ڕوویداوە ؟.

و: ئیسراء ومیعراج دوای تەمەنی پەنجا ساڵی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوویداوە .

ئیسراء : لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا بوو .

ومیعراج : لە مزگەوتی ئەقصاوە بۆ "سدرة المنتهى"بوو ، وبەرزبووەتەوە هەتاکو گوێی لە دەنگی نوسینی قەڵەم بوو ، وهەتا ئەو شوێنەی خودا ﷻ ویستوویەتی ، وبەڵگە ونیشانەی گەورەی لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگاری بینی ، ولەوێ پێنج نوێژەکەی بەسەردا فەرزکرا ، پاشان گەڕایەوە وڕۆژی لە شاری مەککە کردەوە ، ولە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە جبریل عليه السلام کاتەکانی نوێژی بۆ هێنا وبۆی دیاری کرد ، وکاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ باسی شەوڕەوییەکەی کرد ، ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو باوەڕەکەیان پتەو وزیاتر بوو ، وهەروەها دژایەتی وکەللەڕەقی وملهوڕی بێباوەڕانیش زیاتر بوو .

پ٢٧: کەی مانگ شەقی بردووە ودوو کەرت بووە ؟.

و: شەق بردنی مانگ دوای بەسەرهاتی ئیسراء ومیعراج بووە ، کاتێك هاوبەش بڕیاردەران داوایان کرد لە پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵگە ونیشانەیەکیان لەسەر ڕاستی پەیامەکەی پیشان بدات ، مانگی پیشاندان کە بوو بە دوو کەرتەوە ، کەرتێکی لەسەر شاخی ئەبوقوبەیس بوو ، وکەرتێکی لە خوارەوە بوو ، فەرمووی : شایەتمان بهێنن ، پشتیان هەڵکرد وگوتیان : ئەمەی دەیکات جادوویەکی بەردەوامە .

پ٢٨: کەی ڕۆیشتووە بۆ لای هۆزی ثقیف ، وحاڵی چۆن بوو لەگەڵیان ، وچۆن وەڵامیاندایەوە ، وچۆن گەڕایەوە ؟.

و: کاتێك ئەبوتالبی مامی وەفاتی کرد ، هاوبەش بڕیاردەران زیاتر تووشی ئەزیەت ومەینەتیان کرد ، بۆیە چوو بۆ لای هۆزی ثقیف بۆ ئەوەی بانگەوازیان بکات بۆ لای خودا ، ودالدەی بدەن وسەری بخەن هەتاکو پەیامەکەی پەروەردگاری بگەیەنێت بە خەڵك ، هیچ کەس وەڵامی لە وەڵامی ئەو هۆزە ناشیرینتر وخراپتر نەبوو ، ولە هەمووان زیاتر ئەزیەتیاندا ، هەتاکو منداڵەکانیان هاندا ، بەردبارانیان کرد ، وپاژنەی پێییان

خوێناوی کرد ، کاتێك گەڕایەوە بۆ مەککە ، نەچووە شارەوە بە هۆی داڵدەدانی موتعمی کوڕی عەدییەوە نەبێت .

پ٢٩: کەی جن گوێیان بۆ خوێندنی قورئانی پێغەمبەری خودا ﷺ گرت ، وئەو ڕووداوە لە چی شوێنێك ڕوویداوە ؟.

و: لە ژێر دارخورمایەك بوو لە نێوان مەککە وتائیف ، کاتێك لای هۆزی ثقیف گەڕایەوە ، وسورەتی "الرحمن"یان لە پێغەمبەری خودا ﷺ بیست کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە : ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾(الرَّحْمَـٰن) ، واتە : کام نازونیعمەتی پەروەردگارتان نکولی دەکەن وبەدرۆی دەزانن وباوەڕناهێنن ، ئەی گرۆهی مرۆڤ وجن ؛ لە وەڵامدا جنەکان گوتیان : هیچ کام لە نازونیعمەتەکانت نکولی ناکەین وبە درۆی نازانین ، ئەی پەروەردگارمان سوپاس وستایش بۆ تۆ ، وخودا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى لەو بارەیەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ ٢٩﴾(الأَحْقَاف) ، واتە : کۆمەڵە جنێکمان نارد بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان بگرن کاتێك دەیخوێنیتەوە ؛ وهەروەها سورەتی :

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ ①﴾(الجِنّ) ، واته : ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ : وەحیم بۆ کرا کە کۆمەڵێك لە جن گوێیان لە قورئان گرتووە کاتێك من خوێندوومەتەوە .

**پ٣٠**: دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە تائیف گەڕایەوە چی دەکرد ؟.

**و**: خۆی بە خەڵك دەناساند لە بۆنە وکۆبوونەوەکانیان ، وبە دوای ئەوەدا دەگەڕا کەسانێکی دەست بکەوێت سەری بخەن وپارێزگاری لێ بکەن هەتاکو پەیامەکەی پەروەردگاری بگەیەنێت ، هەتا خودا ﷻ ئەوەی بۆ ئاسان وفەراهەم کرد ، ولەگەڵ شاندی پشتیوانان کە حزبی "الرحمن" وکۆمەڵی باوەڕدار بوون ، کۆ بوویەوە .

**پ٣١**: ژمارەی شاندەکەی پشتیوانان چەند کەس بوون ؟.

**و**: یەکەم شاندیان شەش کەسی خەزرەجی بوون ، وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەری خودایان ﷺ دایەوە ، دوای ئەوە ئەوانیش بانگەوازی خزم وکەسوکاریان کرد ، ساڵی ئایندە شاندێکی تریان هاتن بۆ مەککە ، کە

پێکهاتبوون لـه دوو کەسی ئەوسی ودە کەسی خەزرەجی ، ئەمەش "بیعة العقبة"ی یەکەمە ، وپێغەمبەری خودا ﷺ موصعەبی کوڕی عومەیری ﵁ وەك مامۆستا وفێرکار لـەگەڵدا ناردن ، ئیسلام بە هۆیەوە ڕۆیشتە هەموو ماڵـەکانی شاری مەدینە ، ولـە ساڵی ئایندە شاندێکی تریان هاتن بۆ دیداری پێغەمبەری خودا ﷺ کە پێکهاتبوون لـە حەفتا وسێ پیاو ودوو ئافرەت ، ئەمەش "بیعة العقبة الثانية الكبرى"یە ، کە هەمان بەیعەتی ئەو ئافرەتانەیە لـە ئایەتەکەی سورەتی "الممتحنه"[٢] باسی هاتووە ، کە بەیعەتیاندا بە پێغەمبەری خودا ﷺ بپارێزن وەك چۆن منداڵ وهاوسەرەکانیان دەپارێزن ، ولـە پاداشتی ئەوەدا بەهەشتیان بۆ هەیە .

(٢) . مەبەست لـەم ئایەتەیە : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَـٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾(المُمْتَحنَةِ) .

پ٣٢: ئەو شاندە چەندێکیان لە هۆزی ئەوس بوون ، وچەندێکیان لە هۆزی خەزرەج بوون ؟.

و: یازدەیان لە هۆزی ئەوس بوون ، کە سیانیان "نقیب"بوون ، وشەست ودوویان لە هۆزی خەزرەج بوون نۆیان "نقیب" بوون ، وئەو بەیعەتنامەیە عەباسی کوڕی عبدالمطلبی مامی پێغەمبەری خودا ﷺ ئامادەی بوو ، بۆ جەخت کردنەوە لەو بەیعەتەی کە پشتیوانان بە برازاکەیانداوە ، پاشان ڕوخسەتی پێدرا بە کۆچ کردن بۆ مەدینە .

پ٣٣: کێ یەکەم کەس بوو لە موسڵمانان کۆچی کرد بۆ مەدینە ؟.

و: یەکەم کەس کە کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدئەسدی مەخزومی مێردی ئوم سەلەمە بوو ، پاشان موسڵمانان دوای ئەو کۆچیان کرد .

س٣٤: کەی ڕوخسەت درا بە پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچ بکات ؟.

و: کاتێك هاوبەش بڕیاردەران بینییان خودا ﷻ پشتیوان وسەرخەر ویارمەتیدەری بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ پەیدا کرد وفەراهەمی کردن ،

وهاوەڵانی شوێنێکیان پەیدا کرد کە تێیدا ئارام بوون وکۆچیان بۆ دەکرد ، وبرا گەلێکی ڕاستگۆیان دەست کەوت لەوێ داڵدەیان دەدان وسەریان دەخستن ، کۆبوونەوە بۆ ئەوەی پیلانێك دابڕێژن پێغەمبەری خودا ﷺ بەند بکەن وبیبەستنەوە ، یان بیکوژن ، یان شار بەدەری بکەن ، پاشان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بیکوژن ، هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ هات ، لە شەوێکدا دەرچوو گەنجەکانی قورەیش بە شمشێرەکانی دەستیانەوە چاودێرییان دەکرد بۆ ئەوەی بیکوژن ، سەرەتای سورەتی (یس)ی بەسەردا خوێندنەوە ، وخۆڵی کرد بەسەریاندا ، بێدار نەبوونەوە کاتێك نەبێت دەبینن چاودێری عەلی کوڕی ئەبوتالب رضي الله عنه دەکەن ، کە لەسەر جێگاکەی پێغەمبەری خودا ﷺ نوستووە ، ونەیانزانی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ کوێ ڕۆیشتووە .

س٣٥: چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ دەرچوو وکۆچی کرد ، وکێ لەگەڵیدا کۆچی کرد ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر رضي الله عنه کۆچی کرد ولە شاری مەککە دەرچوون ، وڕۆیشتن بۆ ئەشکەوتی "ثور" ، ولەگەڵ ئەو کەسەی

که چاوساغ ورێ نیشاندەریان بوو رێککەوتن دوای سێ رۆژ دوو حوشترەکەیان بۆ بێنێت ، چوونە نێو ئەشکەوتی "ثور"ەوە ، وهاوبەش بڕیاردەران بە پەرۆشەوە بە دوایاندا دەگەڕان ، هەتاکو چوونە سەر ئەشکەوتەکە ، خودا ﷻ کوێری کردن لە ئاست بینینی پێغەمبەری خودا ﷺ وئەبوبەکری هاوەڵی رضي الله عنه ، دەبێت گومان چۆن بێت بە دوو کەس کە خودا سێیەمیان بێت ویارمەتیدەر وسەرخەریان بێت ، کاتێك سێ رۆژ تێپەڕی وهەوڵی بە دوادا گەڕانی هاوبەش بڕیاردەران هێوەر بوویەوە ، رێ نیشاندەرەکە دوو حوشترەکەی بۆ هێنان ، وسوار بوون ، سوراقەی کوڕی مالکی کوڕی جوعوشمیان پێگەیشت ، کاتێك نزیك بوویەوە لێیان ، دەست وپێکانی ئەسپەکەی چوون بە ناخی زەویدا ، ویستی هەستێتەوە دووبارە چوو بە ناخی زەویدا ، داوای ئەمان وبەخشینی کرد ، بەو مەرجەی ئەم هەواڵە لەو کەسانە بشارێتەوە کە بە دوایاندا دەگەڕێن .

پ٣٦: کەی پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتە قوباء ؟.

و: رۆژی دوو شەممە دوازدەی مانگی رەبیعی یەکەم گەیشتە قوباء ، لەوێ مزگەوتی قوبائی دروست کرد ، کە لەسەر بناغەی لە خودا ترسان

وپارێزکاری بنیاتنراوە لە یەکەم ڕۆژەوە ، ومزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداش ﷺ کە شاری مەدینەیە لەسەر بناغەی لە خودا ترسان وپارێزکاری بنیاتنراوە ، ولە پێشترە بۆ ئەو وەسفە .

پ٣٧: چەند ڕۆژ لە قوباء لەگەڵ خەڵکەکەیدا مایەوە ؟.

و: ئیبن ئیسحاق دەڵێت " ڕۆژی دووشەممە ، وسێ شەممە ، وچوارشەممە وپێنج شەممە لەوێ مایەوە ، پاشان ڕۆژی هەینی بە ڕێکەوت ، لە "بنوسالم بن عوف" کاتی نوێژی هەینی هات ، ئەوە یەکەم نوێژی هەینی بوو لە مەدینە ، بەڵام "بنوعەمری کوڕی عەوف" دەڵێن : لەو ماوەیە زیاتر لە نێو ئەواندا ماوەتەوە .

پ٣٨: لە شاری مەدینە لە کوێ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزی ؟.

و: کاتێك گەیشتە شاری مەدینە هەموو پشتیوانێك "أنصار" داوای لێ دەکرد میوانی ئەو بێت ولای بمێنێتەوە ، فەرمووی : واز لە حوشترەکە بهێنن ، چونکە فەرمانی پێکراوە ، هەتاکو لە شوێنی مزگەوتەکەی یخیدا ودانیشت ، وئەبوئەیوب خالدی کوڕی زەید رضي الله عنه باری حوشترەکەی

هەڵگرت ، هەتاکو ئەو کاتەی مزگەوت ومالّی خێزانەکانی دروست کرد لای ئەبوئەیوب مایەوە ، وخودا زاناترە .

س٣٩: خەڵك دوای کۆچ بوون بە چەند بەشەوە ؟.

و: لە شاری مەککە : کەسانێکی بێباوەڕانی دژە ئیسلام ، وباوەڕدارانێکی لاواز وبێ دەسەڵات مانەوە کە نەیانتوانی کۆچ بکەن ، ولە شاری مەدینە : باوەڕداران هەبوو کە دۆستایەتی ودژایەتیان لەبەر خودا دەکرد ، کە بریتی بوون لە کۆچەرییەکان وپشتیوانان "المهاجرون والأنصار" ، وکەسانێکی کەللە ڕەقی لەخۆباییش بوونیان هەبوو کە جوولەکەکان بوون ، وهەروەها کەسانی دووڕوو ، ئەگەر بگەیشتنایە بە باوەڕداران دەیانگوت : باوەڕمان هێناوە ، وئەگەر لەگەڵ شەیتانەکانیان بە تەنها بوونایە دەیانگوت : بێگومان ئێمە لەگەڵ ئێوەین .

پ٤٠: لە ساڵی یەکەمی کۆچی کام لە پەرستشەکان بە شەرع کرا ؟.

و: لە مەدینە حەڤدە مانگ لە کاتی نوێژ کردندا ڕوویان دەکردە بيت المقدس ، ولەو ساڵەدا جیهاد وتێکۆشان فەرزکرا ، ونوێژەکان کران بە

چوار ڕكات "نیوەڕ وعەسر وعیشا" لـە شاردا كاتێك لـە سەفەردا نەبن ، لـە ڕۆژی دوازدەی مانگی ڕەبیعی كۆتا ، بانگدانیش تێیدا بە شەرعكرا بۆ دیاری كردنی كاتەكانی نوێژ .

پ٤١: چەند تیپ "سرية" لـەو ساڵە دەرچوون ؟.

و: تیپی حەمزەی كوڕی عبدالمطلب رضي الله عنه لـەگەڵ سی جەنگاوەری كۆچەری بۆ ڕێگری كردن لـە كاروانی قورەیشییەكان لـە مانگی ڕەمەزاندا ، وتیپی عوبەیدەی كوڕی حارث رضي الله عنه لـەگەڵ شەست جەنگاوەری كۆچەری دەرچوون لـە چواری مانگی شەوال ، وتیپی سەعدی كوڕی ئەبووەقاص رضي الله عنه لـەگەڵ بیست جەنگاوەری كۆچەری دەرچوون بۆ ڕێگری لـە كاروانی قورەیش ، لـە مانگی "ذوالقعدة".

پ٤٢: ئەو ڕووداوانە چی بوون كە لـەم ساڵەدا ڕوویداوە ؟.

و: ئەو ڕووداوانەی لـەم ساڵەدا ڕوویداوە : دروستكردنی مزگەوتی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بوو ، وبرایەتی خستە نێوان كۆچەرییەكان وپشتیوانان ، وعائیشەی دایكی باوەڕداران رضي الله عنها لـە مانگی شەوالـدا

گواستەوە ، کە دوو ساڵ پێش ئەو کاتە لە مەککە لەگەڵ سەودە مارەی کردبوون ، ولەم ساڵەدا کۆچەرییەکان تووشی تای مەدینە بوونەوە ، وپێغەمبەری خودا ﷺ نزای کرد وپاڕایەوە ، بۆ ئەوەی ئەو پەتایە لەسەر شاری مەدینە هەڵبگرێت ، وگواستییەوە بۆ "الجحفة".

پ٤٣: کام لە پەرستشەکان لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بە شەرع کرا ؟.

و: لەم ساڵەدا ڕووکردنە کەعبە بۆ نوێژ کردن پێویست کرا لە نیوەی مانگی شەعبان ، وجوولەکە نکولی ئەوەیان کرد لەبەر نەفامی وگێلییان ، ورۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان فەرزکرا ، کە پێش ئەوە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا پێویست بوو ، وزەکاتی سەرفترە فەرزکرا ، ونوێژی جەژن بە شەرع کرا ، وزەکاتی سامانەکان فەرزکرا ، کاتێك بگاتە ئەندازەیەکی دیاری کراو ، وهاوتا لەگەڵ نوێژ لە زۆر شوێنی قورئاندا باسکراوە .

پ٤٤: ئەو غەزایانە کامانە بوون کە لەم ساڵەدا ڕوویانداوە ؟.

و: لەم ساڵەدا ئەم غەزایانە ڕوویانداوە : غەزای ئەبواء لە مانگی صەفەر ، وغەزای بواط لە مانگی ڕەبیعی یەکەم ، وغەزای عەشیرە لە مانگی

جمادی کۆتایی ، وغەزای بەدری یەکەم ، وپاشان غەزای بەدری گەورە ، کە بریتییە لە ڕۆژی جیاکەرەوەی حەق لە پووچەڵی وناڕەوایەتی ، کاتێك هەردوو سوپای باوەڕداران وهاوبەش بڕیاردەران بە یەك گەیشتن لە مانگی ڕەمەزاندا ، ولە حەڤدەی ڕەمەزان ڕوویداوە ، وسورەتی ئەنفال هەموو لەو بارەیەوە دابەزیوە ، وتیایدا باسی حوکمەکانی دەستکەوتەکانی جەنگ ، وئەو سامانانەی بەبێ جەنگ دەستدەکەون ، وحوکمی دیلەکانی جەنگ کراوە ، وژمارەی ئەو کەسانەی لە موسڵمانان ئامادەی بوون سێ سەد ودە وچەند جەنگاوەرێك بوون ، پاشان غەزای "بنوسەلیم" لە مانگی شەوالدا ڕوویداوە ، وهەروەها غەزای "السویق" لە مانگی "ذوالحجة"دا شوێنی کاروانی ئەبوسوفیان کەوتوون .

س٤٥ : چەند تیپ "سریة" لەو ساڵە دەرچوون ؟.

و: لەم ساڵەدا تیپی عبداللەی کوڕی جەحش رضي الله عنه لەگەڵ هەشت جەنگاوەری کۆچەری دەرچوون ، وئیبن الحضرمییان کوشت ، هەموو ئەوە لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەجەبدا ڕوویداوە ، وئەم ئایەتە لەو بارەیەوە دابەزیوە : ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ

﴿٢١٧﴾ (البَقَرَة) ، واتە : ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێدەكەن دەربارەی جەنگان لە مانگە حەرامەكاندا كە بریتین لە مانگەكانی (ذوالقعدة وذوالحجة والمحرم ورجب)، بلێ : جەنگان لەو مانگانەدا تاوانی گەورەیە.

**پ٤٦**: ئەو غەزایانە كامانە بوون كە لە ساڵی سێیەمی كۆچیدا ڕوویانداوە ؟.

**و**: لەم ساڵەدا غەزای "ذو أمر" ڕوویداوە ، ومانگی صفر هەمووی پشوویدا ، پاشان غەزای "الفرع" كۆتایی مانگی ڕەبیعی یەكەم ڕوویداوە ، وغەزای "بنوقینقاع" وسەركەوت بەسەریاندا ، بەڵام ئیبن سەلولی سەرگەورەی دووڕووەكان هاتە سەر ڕێگای ، وتكای بۆ كردن ، وپێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر ئەو ئازادی كردن ، وغەزای ئوحود لە نیوەی مانگی شەوالی ئەم ساڵەدا ڕوویداوە ، ولەم ساڵەدا حوكمی نوێژ نەكردن لەسەر شەهیدەكان وناشتنیان بە پۆشاك وخوێنەكەیانەوە بە شەرع كراوە ، وهەروەها دروستی ناشتنی زیاتر لە یەك كەس لە گۆڕێكدا لەبەر زەرورەت ، وناشتنیان لەو شوێنەی كە كوژراون ، پاشان غەزای "حمراء الأسد" كە سورەتی آل عمران لە ئایەتی : ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ

مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢١﴾ هەتاكو : ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ ﴿١٧٩﴾(آلِ عِمۡرَانَ) ، لەو بارەیەوە دابەزیوە .

پ٤٧: چەند تیپ "سرية" لەو ساڵە دەرچوون ؟.

و: تیپی زەیدی كوڕی حارثە ﷺ دەرچوون بۆ سەر كاروانی قورەیش وبە دەستكەوت گرتیان ، لە مانگی جمادی كۆتایی ، وتیپی محمدی كوڕی مەسلمە ﷺ لەگەڵ چوار كەس دەرچوون بۆ كوشتنی كەعبی كوڕی ئەشرەف ، وئەم بەسەرهاتە بەڵگەی دروستی فێڵی تێدایە لە شەڕدا .

پ٤٨: چەند غەزا لە ساڵی چوارەمی كۆچیدا ڕوویانداوە ؟.

و: لەم ساڵەدا غەزای "بنوالنضير" وشار بەدەركردنیان ڕوویداوە ، وسامانەكانیان وەك سامانی بێ جەنگ دەستی بەسەردا گیراوە ، وسورەتی "الحشر" لەو بارەیەوە دابەزیوە ، ولەم ساڵەدا لە مانگی ڕەبیعی یەكەم مەی حەرام كراوە ، وهەروەها غەزای "ذات الرقاع" لە مانگی جمادی یەكەم لەسەر بۆچوونێك ڕوویداوە ، بەڵام ئەوەی كە پەسەندە لە ساڵی حەوتەم لە دوای خەیبەر ڕوویداوە ، وهەروەها تیپی عەمری الضمری

ﷺ لە مانگی صفردا دەرچوون ، وتیپی قورئان خوێنەکان هەر لەم ساڵەدا بوو ، کە ڕەعل وزەکوان وعەصەییە ناپاکییان بەرامبەر کردن وغەدریان لێکردن ، کە حەفتا پیاو بوون ، وپێغەمبەری خودا ﷺ یەك مانگ نزای قنوتی لێ کردن ، ولەم ساڵەدا زەیدی کوڕی ثابت رضي الله عنه کتێبی جوولەکەکانی برد .

**پ٥٠**: لە ساڵی پێنجەمی کۆچی چی ڕوویداوە ؟.

و: لەم ساڵەدا غەزای "دومة الجندل" لە مانگی ڕەبیعی یەکەم ڕوویداوە ، ولە مانگی شەوالدا غەزای ئەحزاب ، پاشان غەزای "قريظة" دوای گەڕانەوەی لە غەزای خەندەق ، وحوکمی سەعدی کوڕی موعازیان رضي الله عنه دەربارەیان ڕەچاو کرد ، کە بریتی بوو لەوەی : جەنگاوەرەکانیان بکوژرێت ، ومنداڵ وهاوسەرەکانیان بە کۆیلە بکرێن ، وسامانەکانیان بە دەستکەوت دەستی بەسەردا بگیرێت ، وئەم ئایەتانەی سورەتی ئەحزاب لە بارەیانەوە دابەزی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ۝٩﴾ هەتاکو : ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ۝٢٧﴾(الأَحْزَاب) .

پ٥١: ئەو ڕووداوانە چی بوون کە لەم ساڵەدا ڕوویانداوە ؟.

و: لەم ساڵەدا سەعدی کوڕی موعاز رضي الله عنه وەفاتی کرد ، دوای ئەوەی حوکمی کرد بە کوشتنی "بنوقريظة" ، وپێنج کەس لە هۆزی خەزرەج ئیبن ئەبوحەقەیقیان کوشت دوای "قريظة" ، ئەو کەسەیان ڕاستەوخۆ دەستی هەبوو لە کوشتنیدا : عبداللەی کوڕی عەتیك بوو ، ودوای ئەو خالدی کوڕی نوبەیحی هوزلی کوژرا لە لایەن عبداللەی کوڕی ئونەیسەوە ، وهەر لەم ساڵەدا پێغەمبەری خودا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی مارەکرد ، وپێش ئەمە بە چەند ڕۆژێك ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیانی مارە کرد ، لە مانگی "ذوالقعدة" ، وچەند ئایەتێك لە سورەتی ئەحزاب دابەزی ، لەوانە ئایەتی حیجاب .

س٥٢: ئەو پەرستشانە چی بوون کە لە ساڵی شەشی کۆچیدا بە شەرع کران ؟.

و: لەم ساڵەدا نوێژی ترس بە شەرع کرا ، لە غەزای "عسفان" لە مانگی جمادی یەکەم ، ولە مانگی ذوالقعده پێغەمبەری خودا ﷺ عومرەی حودەیبیەی کرد کە هاوبەش بڕیاردەران ڕێگەیان پێگرت ، ولەم ساڵەدا

"بيعة الرضوان" ڕوویداوە ، وحوکمی ئەو کەسەی ڕێگای پێدەگیرێت حەج یان عومرە بکات بە شەرع کرا ، وهەر لەم ساڵەدا حەج فەرز کراوە لەسەر بۆچوونی شافعی .

پ٥٣: ئەو غەزایانەی لەم ساڵەدا ڕوویانداوە کامانە بوون ؟.

و: لە مانگی جمادی یەکەم غەزای "بنو لحيان" کە هەمان غەزای "عسفانە" ڕوویداوە ، کە نوێژی ترس لە کاتی نوێژی عەسردا بە شەرع کراوە ، وهەروەها غەزای "ذوقرد" ، وگوتراوە : لە ساڵی حەوتەمدا ڕوویداوە ، ئەو غەزایە بوو کە عویەیینە دایان بەسەر مەڕ ومالاَتی پێغەمبەری خودادا ﷺ لە لەوەڕگا ، بەلاَم سەلەمەی کوڕی ئەکوەع رضي الله عنه لە دەستیان ڕزگاری کردن ، پێش ئەوەی سوارچاکەکانی پێغەمبەری خودایان ﷺ پێ بگات ، وپێغەمبەری خودا ﷺ بەشی سواری وپیادەشی پێدا ، ولە مانگی شەعبان غەزای "بنو المصطلق" ڕوویداوە ، کە جوەیرییەی خێزانی پێغەمبەری خودا ﷺ لەو هۆزەیە ، وئەو هۆکار بوو منداڵ وژنەکانیان کە بە کۆیلە گیرابوون ئازاد بکرێن ، ولەو غەزایەدا ئیبن سەلول قسەی بە هاوەلاَنی پێغەمبەری خودا ﷺ کرد ، وسورەتی (المنافقين) دابەزی ،

وهەر لەم ساڵەدا ڕووداوی "الإفك" ڕوویداوە ، وبەرائەتی عائیشەی دایکی باوەڕداران رضي الله عنها دابەزی لە پازدە ئایەتی سورەتی (النور)دا ، وداری حەد درا لەو کەسانەی ئەو تۆمەتەیان دایە پاڵی ، وهەندێك لە زانایان پەیماننامەی حودەیبیەشیان بە غەزا لە قەڵەم داوە ، بە هۆی کۆتاییەکەی وئەو بەیعەتەی تێیدا دراوە ، وهەندێکی تریان بە غەزایان لە قەڵەم نەداوە ، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ غەزا وشەڕ دەرنەچوو .

س٥٤: سیفەتی پەیماننامەی حودەیبیە چۆن بوو ؟.

و: پەیماننامەی حودەیبیە لە نێوان پێغەمبەری خودا ﷺ وقورەیش هاتە ئاراوە ، کە شەڕ وکوشتاری یەکتر نەکەن بۆ دە ساڵ ، وهەر کەسێك لە هاوبەش بڕیاردەران بێت بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ وموسڵمان بێت بیگەڕێنێتەوە ، وهەر کەسێك لە موسڵمانان بچێت بۆ لای هاوبەش بڕیاردەران ئەوان نەیگەڕێننەوە ، هەرکەسێك بیەوێت دەبێتە هاوپەیمانی پێغەمبەری خودا ﷺ ، وهەر کەسێك بیەوێت دەبێتە هاوپەیمانی قورەیش ، خوزاعە بوون بە هاوپەیمانی پێغەمبەری خودا ﷺ ، وبنوبەکر بوون بە هاوپەیمانی قورەیش ، وئەمساڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بگەڕێتەوە ونەچێتە

شاری مەککە ، وساڵی ئاینده عومره بكات ، ودانیشتووانی شاری مەککە سێ ڕۆژ شاریان بۆ بەجێ دەهێڵن ، ونوسراوەکەیان لەسەر ئەوە مۆرکرا ، وهەموو سورەتی (الفتح) لەوبارەیەوە دابەزی ، وئەو ئاشتەواییە بوو بە سەرکەوتنێکی ئاشکرا .

**پ٥٥: چی دابەزی دەربارەی نەسخی هەندێك ئایەت ؟.**

و: لە بارەی ئەو ئافرەتانەی کە کۆچ دەکەن ئایەتی تاقیکردنەوە(٣) دابەزی ، کە ئەگەر زانرا باوەڕدارن حەلاڵ نییە بیانگەڕێنێتەوە بۆ لای هاوبەش بڕیاردەران ، چونکە ئەو ئافرەتانە بۆ ئەوان حەلاڵ نین ، وئەوانیش حەلاڵ نین بۆیان ، وقورەیش وازیان لەو مەرجەیان هێنا ، کە هەر موسڵمانێك کۆچ بكات بیگەڕێننەوە بۆ لای قورەیشییەکان ، چونکە

---

(٣). مەبەست لەم ئایەتەیە : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَـٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝١٢﴾(المُمْتَحنَةِ) .

ئەو موسڵمانانەی کۆچیان دەکرد لە شوێنێکی تر کۆ دەبوونەوە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ دەیگەڕاندنەوە ، وڕێگەیان لە قورەیش دەگرت .

**پ٥٦**: ئەو تیپانە "سرية" کامانە بوون کە لەم ساڵەدا دەرچوون ؟.

و: لەم ساڵەدا تیپی ئەبوعوبەیدە رضي الله عنه دەرچوون بۆ "ذوالقصة" ، وتیپی زەیدی کوڕی حارثە رضي الله عنه دەرچوون بۆ سەر "بنوسليم" ، وتیپێکی تری لە مانگی جمادی یەکەم دەرچوو بۆ "بنوثعلبة" ، وتیپێکی تر دیسان لەم مانگەدا بۆ سەر کاروانی "ئەبوالعاص" ، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ داڵدەیدا لەبەر هاوسەرەکەی کە زینەبی کچی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو ، ولەگەڵ بازرگانییەکەی گەڕاندیەوە ، وتیپی عبدالرحمانی کوڕی عەوف رضي الله عنه بۆ سەر "دومة الجندل" کە موسڵمان بوون ، ولەم ساڵەدا ڕووداوی عورەنییەکان ڕوویداوە ، کە دژایەتی خودا وپێغەمبەرەکەیان کرد ، وشوانەکەی پێغەمبەری خودایان ﷺ کوشت ، وحوشترەکانیان دالەبەر ، بەڵام نەیانتوانی هەڵبێن ودەستگیر کران ، ولە خاچ دران

وكوژران ، ودەست وپێیان بە چەپ وڕاست بڕدرا ، وچاویان بە سووژنی داخ ڕشتن وكوێریان كردن(٤).

پ٥٧: پێغەمبەری خودا ﷺ لەم ساڵەدا چەند نوسراوی بۆ پادشاكان نارد ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ لەم ساڵەدا بە دەستی دحیەی كوڕی خەلیفە رضي الله عنه نامەی نارد بۆ قەیسەری پادشای ڕۆمەكان ، وبە دەستی عبداللەی كوڕی حوزافەی سەهمی رضي الله عنه نامەی بۆ كیسرای پادشای فارسەكان نارد ، وبە دەستی عەمری كوڕی ئومەیەی زەمری رضي الله عنه نامەی بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە نارد ، وبە دەستی حاتبی كوڕی ئەبوبەلتەعە رضي الله عنه نامەی بۆ مقۆقسی پادشای ئەسكەندەرییە نارد ، وبە دەستی عەمری كوڕی عاص رضي الله عنه نامەی بۆ جەیفەر وعەبدی كوڕەكانی جولەندی ئەزدی نارد كە پادشای عومان بوون ، وسەلیت كوڕی عەمری رضي الله عنه نارد بۆ لای ثومامەی كوڕی ئوثال ، وعەلای كوڕی حەزرەمی رضي الله عنه نارد

(٤). ئەو سزایەیان تۆڵە كردنەوە بوو ، چونكە ئەوانیش بەو شێوەیان بە شوانەكەی پێغەمبەری خودا ﷺ كرد بوو .

بۆ لای مونزری کوڕی ساوای عەبدی پادشای بەحرەین ، وشوجاعی کوڕی وەهەبی ئەسەدی ﷺ نارد بۆ لای حارسی کوڕی ئەبو شمری غەسانی پادشای ناوچەی شام ، وگوتراوە ئەم پیاوەی بۆ لای جەبلەی کوڕی ئەبهەمی غەسانی ناردووە ، وموهاجری کوڕی ئومەیەی مەخزومی ﷺ نارد بۆ لای حارسی کوڕی عەبدکلال حمیەری ، ئەمە لە مانگی ذوالحجە دا بووە وەك باس دەکرێت ، وخودا زاناترە .

س٥٨: ئەو غەزایانە کامانە بوون کە لە ساڵی حەوتی کۆچیدا ڕوویانداوە؟.

و: ئەوەی کە پەسەندە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە غەزای "ذوقرد" لە سەرەتای ئەم ساڵەدا ڕوویداوە ، پاشان دوای ئەوە بە سێ ڕۆژ غەزای خەیبەر ڕوویداوە ، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ ئەوەی بە ڕاشکاوی ڕاگەیاندووە ، وکەس لە هاوەڵانی "بیعة الرضوان" لەم غەزایە دوانەکەوتن جگە لە جابری کوڕی عبداللە ﷺ ، وپێغەمبەری خودا ﷺ پاداشت وپشکی بۆ دیاری کرد ، وقەڵا وکۆشکەکانی خەیبەر هەمووی ڕزگار کران ، وسامانەکانیان بە دەستکەوت گیرا ، ونیوەی ئەو سامانەی دابەش کرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا ، ونیوەی هێشتەوە بۆ کاتی

پێویست ونارەحەتییەکان ، وپێغەمبەری خودا ﷺ پشکی بۆ هەندێك لە هاوەڵان دیاری کرد کە ئامادەی ئەو غەزایە نەبوون ، بە ڕوخسەتی ئەو جەنگاوەرانەی ئامادەی غەزاکە بوون ، وپێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ دانیشتووانەکەی ڕێککەوت کە کار لە کێڵگەکانی بکەن بە نیوەی بەرهەمەکەی ، ولەم غەزایە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کرا ، وهەروەها مارەکردنی موتعە حەرام کرا ، وگوتراوە : پێش ئەو کاتە حەرام کراوە ، وئەو مەڕەی کە ژەهری پێوە کراو لەم کاتەدا بوو ، وبازووی مەڕەکە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ کرد ، وهەر لەم کاتەدا جەعفەری کوڕی ئەبوتالب رضي الله عنه لە تاراوگەی حەبەشە گەڕایەوە ، وشاندی ئەشعەرییەکانیشیان لەگەڵ بوون ، ولەم ساڵەدا ئەبوهرەیرە رضي الله عنه موسڵمان بووە ، ولەگەڕانەوەیدا پێغەمبەری خودا ﷺ صەفییەی مارە کرد ، وگەمارۆی "وادی القری"دا وڕزگاری کرد ، وبە هەمان شێوەی خەیبەر لەگەڵیاندا ڕێککەوت ، وخودا سبحانه وتعالى زەوی فەدەکی بەبێ شەڕ خستە ژێر دەستی کە هیچ ئەسپ وسوارییەکی بۆ تاو نەدابوو .

**پ٥٩**: ئەو تیپانە کامانە بوون کە لەم ساڵەدا دەرچوون ؟.

و: تیپی ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه بۆ سەر فەزارە ، وتیپی عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه بۆ سەر هەوازن ، وتیپی عبداللەی کوڕی ڕەواحە رضي الله عنه بۆ سەر یوسەیری کوڕی ڕەزام وئەوانەی لەگەڵیدا بوون ، هەموویان کوژران ، وئوسامەی کوڕی زەیدی رضي الله عنهما ناردە سەر حروقاتی کوڕی جوهەینە ، وپێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم گلەیی لێکرد لەبەر کوشتنی ئەو کەسەی شایەتمانی هێنا بوو ، وتیپی ئەبوحەدرەد رضي الله عنه بۆ سەر "الغابة" ، وتیپی ئەو کەسەی کە فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد بچنە نێو ئاگرەوە ، بۆ ئەوەی گوێڕایەڵییان تاقی بکاتەوە ، وپێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : گوێڕایەڵی دروستکراو ناکرێت لەسەرپێچی دروستکار ، وتیپێکی ناردە سەر "بنوسلیم" ، وهەر لەم ساڵەدا عومرەی قەزای ئەنجامدا لە مانگی ذوالقعدە ، وەك پێشتر باسکرا لە پەیماننامەی حودەیبیە ، ولە گەڕانەوەی مەیمونەی گواستەوە کاتێك حەلاڵ بوون ولە ئیحرامدا نەبوون ، وهەر لەم ساڵەدا پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم زەینەبی کچی گەڕاندەوە بۆ لای ئەبوالعاص کوڕی ئەسلم کاتێك موسڵمان بوو ، لەسەر هەمان گرێبەستی مارەبڕینی یەکەم لەسەر بۆچوونی پەسەند .

**پ٦٠**: ئەو غەزایانە چی بوون کە لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا ڕوویانداوە؟.

**و**: لە مانگی جمادی یەکەم غەزای موئتە ڕوویداوە کە زەیدی کوڕی حارثە وجەعفەری کوڕی ئەبوتالب وعبداللەی کوڕی ڕەواحە ﵃ شەهید کران ، ولە مانگی ڕەمەزاندا فەتحی گەورە ڕوویدا وشاری مەککە ڕزگار کرا ، بە هۆی ئەوەی قورەیش ئەو پەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ هەیانبوو پێشێلیان کرد ، ویارمەتی (بنوبەکر)یاندا دژی خوزاعە ولە حەرەمدا کوشتاریان کردن ، وئەمە ئەو سەرکەوتنە بوو کە خودا ﷻ ئیسلامی پێ بە عیزەت کرد ، وبت وپەیکەرەکان شکێندران ، ودوای ئەمە غەزای هەوازن ڕوویدا ، وهەر لەوێ ڕووبەڕووبوونەوەی حونەین ڕوویدا ، پاشان غەزای تائیف وگەمارۆدانی ، بەڵام ڕزگار نەکرا هەتاکو ساڵی ئاینده خۆیان هاتن وموسڵمان بوون ، ولەگەڕانەوەدا پێغەمبەری خودا ﷺ نییەتی عومرەی هێنا لە جیعرانەوە ، دوای دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ لە مانگی ذوالقعده .

**پ٦١**: ئەو تیپانە کامانە بوون کە لەم ساڵەدا دەرچوون ؟.

و: تیپی شوجاعی کوڕی وەهەب رضي الله عنه بۆ سەر هەوازن ، وکەعبی کوڕی عومەیر رضي الله عنه بۆ سەر قوزاعە ، کە خۆی وهەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون شەهید کران ، وگوتراوە : عەمری کوڕی عاصی رضي الله عنه ناردووە بۆ "ذات السلاسل" پاشان کۆمەکی کرد بە کۆمەڵێك جەنگاوەر لە کۆچەرییەکان کە ئەبوبەکر وعومەریشیان لەگەڵدا بوو ، وئەبوعوبەیدەی کرد بە ئەمیریان ، کاتێك گەیشتن بەیەك بەرپرسیارێتیەکەی سپێردرا بە عەمری کوڕی عاص رضي الله عنه ، ولەم کاتەدا تەیەمومی کرد لەبەر زۆر ساردی کەشوهەوا ، ونوێژی بە هاوەڵەکانی کرد ، وپێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم دانی بە کارەکەیدانا ونکولی لێنەکرد ، پاشان تیپی ئەبوعوبەیدە رضي الله عنه نارد بۆ سیف البحر ، کە باسی ماسی عەنبەرەکەی لەم کاتەدا بووە ، هەموو ئەمانە پێش ڕزگار کردنی شاری مەککە بووە ، وتیپی خالدی کوڕی وەلید رضي الله عنه نارد بۆ سەر بنوجوزەیمە ، کە گوتیان : صبأنا ، وبە جوانی نەیانزانی بڵێن : موسڵمان بووین ، لێیان کوژا ولێیان بە دیل گیرا ، وپێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم عەلی کوڕی ئەبوتالبی رضي الله عنه نارد خوێنبایی کوژراوەکانی پێدان وسامانەکانی بۆ گەڕاندنەوە ، ودوای ئەوە ناردی بۆ

تێکدان وشکاندنی بتی عوزا ، ئەو دوو ڕووداوە لە ماوەی نێوان فەتحی مەککە وغەزای هەوازندا بوو .

پ٦٢: ئەو غەزایانە کامانە بوون کە لە ساڵی نۆی کۆچیدا ڕوویانداوە ؟.

و: لەم ساڵەدا غەزای تەبوك ڕوویداوە کە بریتییە لە غەزای "العسرة" وعوسمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه سێ سەد حوشتری بە پێداویستی وبارەکانیانەوە بەخشی لە پێناوی خودا ، وعەلی کوڕی ئەبوتالیبی رضي الله عنه لەسەر مەدینە جێهێشت ، وئاشتەوایی کرد لەگەڵ دانیشتووانی "أيلة ، وأذرح ، وأكيدر ، ودومة" ، ودوای ئەوەی بیست ڕۆژ لە تەبوك مایەوە گەڕایەوە ، وڕیسوایی دووڕووەکان ڕوویدا ، کە خودا سبحانه وتعالى دەربارەیان چەند ئایەتێکی لەسەر دابەزاندن : ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ ٧٤﴾(التَّوۡبَةِ) ، ولەم ساڵەدا مزگەوتی "الضرار" ڕووخێندرا ، وخودا سبحانه وتعالى تەوبەی لەو سێ هاوەڵە قەبوڵ کرد کە لە غەزای تەبوك دواکەوتبوون ، کە بریتی بوون لە : کەعبی کوڕی مالك ، ومورارەی کوڕی ڕەبیع ، وهیلالی کوڕی

ئومەییە ، وکەس جگە لەمان لە باوەڕداران ئەوانەی کە دارا بوون وتوانای دەرچوونیان هەبوو دوانەکەوتبوون بە هۆی عوزری شەرعییەوە نەبێت .

پ٦٣: پێغەمبەری خودا ﷺ کێی کردە ئەمیری حەج لەم ساڵەدا ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەبوبەکری صدیقی رضی الله عنه کردە ئەمیری حەج لەم ساڵەدا ، وعەلی کوڕی ئەبوتالبی رضی الله عنه نارد بەدوایدا ، کە سەرەتای سورەتی تەوبە بە خەڵك ڕابگەیەنێت لە حەجدا ، وڕایگەیاند کە لە ئەمساڵ بەدواوە هاوبەش بڕیاردەر حەج ناکات ، وکەس بە ڕووتی تەواف ناکات بە دەوری کەعبەدا ، وئەم ساڵە بە ساڵی شاندەکان ناونراوە ، لەبەر زۆری هاتنی شاندەکان تیایدا .

پ٦٤: باسی هەندێك لەو شاندانە بکە کە هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ باس کردنی ئەوەی کامیان پێشتر هاتوون وکامیان دواتر ؟.

و: شاندی تەمیم ، کە ئەم ئایەتە لە بارەیانەوە دابەزیوە : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ ٤﴾(الحُجُرَات) ، واتە : ئەو کەسانەی بانگیان کردیت لە پشتی ژوورەکانەوە ..

وشاندی عبدالقیس پێش فەتحی مەککە .

وشاندی بەنوحەنیفە کە موسەیلەمەی درۆزنیشیان لەگەڵدا بوو .

وشاندی نەجران کە هەشتا وسێ ئایەتی سەرەتای سورەتی آل عیمران لەسەریان دابەزیوە .

وشاندی بەنوعامر .

وشاندی ضمامی کوڕی ثعلبەی برای سەعدی کوڕی بەکر .

شاندی طيء لەگەڵ زید الخیل .

وشاندی عەدی کوڕی حاتەم .

وشاندی دەوس لە خەیبەر ، کە سەرۆکەکەیان توفەیل بوو ، هات بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ پێش کۆچ وموسڵمان بوو .

وشاندی ئەشعەرییەکان کە لەگەڵ ئەو هاوەڵانە هاتن کە دووجار کۆچیان کردبوو بۆ وڵاتی حەبەشە .

وهاتنی فەروەی کوڕی موسەیکی مواردی وەك شاند لە بری کەسوکاری.

وشاندی ئەزد .

وشاندی ئەشعەسی کوڕی قەیسی کندی .

ونێردراوی پادشاکانی حیمر کە تیایدا موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندبوو لـە نوسراوەکەی "ذویزن" ، وپێغەمبەری خودا ﷺ نوسراوێکی درێژی بە عەمری کوڕی حەزمدا رضي الله عنه بۆ ناردن .

وشاندەکانی جەریری بەجەلی رضي الله عنه .

وشاندەکانی وائلی کوڕی حوجر رضي الله عنه .

وشاندی ئەبورەزینی عوقەیلی رضي الله عنه .

وشاندی صوداء.

وشاندی حارثەی بەکری .

وشاندی ئەبوعەقیل .

وشاندی ئەشجەع .

وشاندی فەروەی جوزامی کە ڕۆمەکان کوشتیان .

وشاندی تەمیی کوڕی ئەوسی داری رضي الله عنه .

وشاندی فەزارە .

وشاندی ئەسەد .

وشاندی عەبس ، پێش فەتحی مەککە ، بەڵکو پێش پەیماننامەی حودەیبیە هاتوون .

وشاندی بەنومورە .

وشاندی بەنوثعلبە ، لە جیعرانە .

وشاندی بەنوحارث لە ساڵی دەی کۆچی لە حەجیماڵئاوایی .

وشاندی بەنوکلاب .

وشاندی رئواس کە دیسان لەو هۆزە بوو .

وشاندی بەنوبوکائی .

وشاندی بەنوعەقیلی کوڕی کەعب .

وشاندی ئیبن قوشەیری کوڕی کەعب .

وشاندی کینانە .

وشاندی باهلە .

وشاندی بەنوسەلیم پێش فەتحی مەککە هاتن وئامادەی بوون .

وشاندی بەنوهیلالی کوڕی عامر .

وشاندی بەنوبەکری ، کە شاندی تەغلب بوون .

وشاندی توجەیب لـە خەڵکی یەمەن .

وشاندی خەولان لـە ساڵی دەیەمی کۆچی .

وشاندی جوعفی .

وشاندی ئەزد .

وشاندی بەنوسەعد هوزەیم .

وشاندی بەهراء .

وشاندی عوزره .

وشاندی "بَلِي" که کەسێکیان پرسیاری حوکمی دۆزراوەی کرد .

وشاندی غەسان لە ساڵی دەی کۆچی .

وشاندی غامد دیسان لە ساڵی دەیەم .

وشاندی النخع که کۆتا شاند بوو لە مانگی موحەرەمی ساڵی یازدەی کۆچی هاتووە .

پ٦٥: ئەو تیپ ونێردراوانە کامانە بوون کە لە ساڵی دەی کۆچیدا ڕەوانە کراون ؟.

و: لەم ساڵەدا تیپی خالدی کوڕی وەلیدی ﷺ ناردە سەر نەجران ، هەموویانی هێنا بە موسڵمانی لە سەرەتای مانگی ذوالقعده ، وعەلی ﷺ نارد بۆ وڵاتی یەمەن ، وهەروەها ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ وموعازی کوڕی جەبەلی ﷺ نارد وکردیانی بە بەرپرس لەسەر یەمەن ، وفەرمانی پێکردن ، کار بۆ خەڵك ئاسان بکەن وگرانی نەکەن لەسەریان

، ومژدەیان پێ بدەن ، وتاریان نەکەن ، وتەبابن وناکۆك مەبن ، ولەم ساڵەدا حەجی ماڵ ئاوایی کرد کە پایەکانی ئیسلامی تێدا کامڵ بوو .

**پ٦٦: سیفەتی حەجی ماڵ ئاوایی چۆن بوو ؟.**

و: پێشەوا مسلمی کوڕی حەجاج دەربارەی حەجی پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێت : ئەبوبەکری کوڕی ئەبوشەیبە وئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم هەموویان بۆیان گێڕاینەوە ، لە حاتەمەوە ، ئەبوبەکر دەڵێت : حاتەمی کوڕی ئیسماعیلی مەدەنی بۆی گێڕاینەوە ، لە جەعفەری کوڕی محمدەوە ، لە باوکییە ، دەڵێت : چووین بۆ لای جابری کوڕی عبداللە رضي الله عنهما پرسیاری لە خەڵکەکە کرد ، هەتاکو گەیشتە من ، گوتم : من محمدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم ، دەستی نزمکردەوە بۆ سەرم وقۆپچەی یەکەم ودووەمی کراسەکەمی کردەوە ودەستی خستە سەرسنگم ، من لەو کاتەدا گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووم ، وگوتی : بەخێربێیت ئەی برازام ، بپرسە دەربارەی چی دەتەوێت ، پرسیارم لێکرد کە لەو کاتەدا چاوەکانی لە دەستدا بوو ، وکاتی نوێژ هات عەبایەکی لەبەر بوو بەخۆیەوە پێچابووی ، هەرکاتێك دەیخستە سەر شانەکانی دەهاتە خوارەوە

لەبەر بچووکی ، وپۆشاکەکەی لە جێی هەڵواسینی جلەکانیدا بوو لە تەنیشتیەوە ، بەو عەبایەوە نوێژی بۆ کردین ، پێم گوت : باسی حەجی پێغەمبەری خودام ﷺ بۆ بکە ، بە دەستی هەتاکو نۆی ژمارد وگوتی : پێغەمبەری خودا ﷺ نۆ ساڵ دانیشت وحەجی نەکرد ، پاشان لە ساڵی دەیەمدا بە نێو خەڵکدا بڵاوکرایەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم ساڵ حەج دەکات ، خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ شاری مەدینە ، هەموویان بە تەمای ئەوەبوون کە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ حەج بکەن ، وهاوشێوەی کردارەکانی ئەو کردار بکەن ، لەگەڵیدا دەرچووین هەتاکو گەیشتینە "ذوالحلیفە" لەوێ ئەسمائی کچی عومەیس لە ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه منداڵی بوو ، کە محمدی کوڕی ئەبوبەکر بوو ، هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ چی بکات ؟ پێی فەرموو : خۆی بشوات ، وناوقەدی ببەستێت وپارچەیەك بخاتە شوێنی خوێنەکەی ، وئیحرام بکات ، لە مزگەوتەکە نوێژی کرد وسواری قەصوا بوو "ناوی حوشترەکەیە" ، هەتاکو لە بیابان لەسەر حوشترەکەی بوو ، ئاسۆی بینینی چاو خەڵك بە سواری وبە پیادە لە پێش دەستی بوون ، بە هەمان شێوە لای ڕاست ولای چەپ ولە پشتییەوە ، وپێغەمبەری خودا ﷺ لە نێوماندا بوو قورئانی بۆ

دادەبەزی ، ولێکدانەوەی دەزانی ، هەرچی کردەوەیەکی ئەنجام بدایە ئێمەش ئەنجامان دەدا ، بانگی یەکخودا پەرستی دا : ((لَبَّيكَ اللهمَّ لَبَّيكَ ، لَبَّيكَ لا شريكَ لك لَبَّيكَ ، إن الحمدَ والنعمةَ لك والملكَ ، لا شريكَ لك)) ، وخەڵکیش ئەو تەلبییەیان دەگوتەوە ، پێغەمبەری خودا ﷺ هیچی لێ قەدەغە نەکردن ، وپێغەمبەری خودا ﷺ پابەندبوو بە تەلبییەکەی خۆیەوە ، جابر رضي الله عنه دەڵێت : ئێمە نییەتمان تەنها حەج کردن بوو ، ونییەتمان عومرە کردن نەبوو ، هەتاکو لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ گەیشتینە کەعبە ، دەستی هێنا بە بەردە ڕەشەکەدا ، وسێ جار بە ڕۆیشتنێکی خێرا تەوافی کرد وچوار جار بە ڕۆیشتنی ئاسایی ، پاشان چوو بۆ لای شوێن پێکانی پێغەمبەر ئیبراهیم عليه السلام ، وئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ١٢٥﴾(البَقَرَة) ، شوێن پێکانی پێغەمبەر ئیبراهیمی خستە نێوان خۆی وکەعبەوە ودوو ڕکات نوێژی کرد وسورەتەکانی : ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ی خوێند ، پاشان گەڕایەوە بۆ لای بەردە ڕەشەکە ودەستی پێدا هێنا ، پاشان لە دەرگاکەوە دەرچوو بۆ کێوی صەفا ، کاتێک نزیک

بوویەوە لە صەفا ئەم ئایەتەی خوێند : ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾(البَقَرَة) ، وفەرمووی : لەو شوێنەوە دەست پێ دەكەم كە خودا ﷻ سەرەتا باسی كردووە ، لە صەفاوە دەستی پێكرد وسەركەوت بەسەریدا ، هەتاكو كەعبەی لێ بەدەركەوت ڕووی كردە كەعبە ، خودای بە تاك وتەنها دانا و(اللـه أكبر)ی كرد ، وپاشان فەرمووی : ((لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وحدَهُ لا شريكَ لَه ، لَه المُلكُ ولَهُ الحمدُ يُحيي ويميتُ وَهوَ علَى كلِّ شيءٍ قديرٌ ، لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وحدَهُ لا شريكَ لَه أنجَزَ وعدَهُ ، ونصرَ عبدَهُ ، وَهزمَ الأحزابَ وحدَه)) ، پاشان لەو نێوانە نزا وپاڕانەوەی دەكرد ، هاوشێوەی ئەمەی سێ جار دووبارە كردەوە ، پاشان دابەزی بەرەو مەروە بەڕێكەوت ، هەتاكو پێكانی گەیشتنە ناوجەرگەی شیوەكە ڕای دەكرد ، كە سەردەكەوت بە ئاسایی ڕۆیشت ، هەتاكو گەیشتە كێوی مەروە ، ئەوەی لەسەر صەفا ئەنجامیدا دووبارەی كردەوە ، فەرمووی : ئەگەر بگەڕێمەوە سەرەتا ئاژەڵێ هەدیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا ، وسەرەتا عومرەم دەكرد ، هەركەسێك ئاژەڵی هەدی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با لە ئیحرام دەربچێت وحەلاڵ بێتەوە وبیكات بە عومرە ، سوراقەی كوڕی مالكی كوڕی جوعشوم هەستا وگوتی : ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە بۆ ئەمساڵە

یان بۆ هەمیشەییە ؟ ، پێغەمبەری خودا ﷺ پەنجەکانی بە یەکدا کرد وفەرمووی : عومرە وحەج بەم شێوەیە بەیەکەوەن بۆ هەتاهەتایە "دووجار ئەمەی فەرموو" ، وعەلی رضي الله عنه لە یەمەنەوە هەدی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا ، بینی فاتمە رضي الله عنها حەلاڵ بووە ولە ئیحرام دەرچووە ، وپۆشاکی ڕەنگاڵەی لەبەر کردووە ، وچاوی ڕشتووە ، وعەلی رضي الله عنه نکولی ئەوەی لێکرد ، فاتمە رضي الله عنها گوتی : باوکم فەرمانی بەمە پێکردووم ، وعەلی رضي الله عنه لە عێراق دەیگوت : ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ ، سکالاّم کرد لەسەر ئەوەی فاتمە ئەنجامیداوە ، وداوای فەتوای پێغەمبەری خودام ﷺ کرد لەو بارەیەوە ، وپێم گوت من نکولی ئەو کارەم لێکردووە ، فەرمووی : ڕاست دەکات ، ڕاست دەکات ، تۆ چیت گوت کاتێك نییەتی حەج کردنت هێنا ، گوتم : من بەو شێوەیە حەج دەکەم کە پێغەمبەری خودا ﷺ حەج دەکات ، فەرمووی : من هەدیم هێناوە تۆ حەلاڵ نابیتەوە ، کۆی ئەو ئاژەڵانەی کە عەلی رضي الله عنه لە ولاّتی یەمەنەوە هێنابووی لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خۆی هێنابووی سەد سەربوون ، خەڵك هەموو حەلاڵ بوونەوە لە ئیحرام دەرچوون وقژیان کورت کردەوە ، جگە لە پێغەمبەری خودا ﷺ وئەو

هاوەڵانەی ئاژەڵی هەدییان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ، کاتێك ڕۆژی تەرویە هات ، هەموویان بەڕێکەوتن بۆ مینا ، وتەلبیەیان کرد بۆ حەج کردن ، وپێغەمبەری خودا ﷺ سواری حوشترەکەی بوو ، نوێژی نیوەڕۆ وعەسر ومەغریب وعیشا وبەیانی لەوێ پێکردن ، پاشان کەمێك مایەوە هەتاکو خۆر هەڵهات ، فەرمانی کرد خەیمەیەکی لە موو دروستکراویان لە نەمیرە بۆ هەڵخست ، پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕێکەوت وقورەیش گومانیان نەبوو کە لە المشعر الحرام دەوەستێت وەك چۆن ئەوان لەسەردەمی نەفامیدا لەوێ دەوەستان ، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ لەوێ تێپەڕی کرد هەتاکو گەیشتە عەرەفە ، بینی خەیمەکەیان لە نەمیرە بۆ هەڵخستووە ، ولەوێ مایەوە ، هەتاکو خۆر نزیك بوو لەوەی ئاوابێت ، فەرمانی کرد قەصوایان بۆ ئامادە کرد ، چووە ناوجەرگەی شیوەکە وگوتاری بۆ خوێندنەوە ، فەرمووی : دڵنیابن خوێن وسامانتان لەسەریەك حەرامە ، وەك حەرامی ئەم ڕۆژ ومانگ وشوێنە ، هەموو شتێکی سەردەمی نەفامی لە ژێر پێکانمدایە وبە فیڕۆ دەچێت ، وهەموو خوێنی سەردەمی نەفامی بە فیڕۆ دەچێت ، ویەکەم خوێنێك کە من لە خوێنەکانی خۆمان بە فیڕۆی دەدەم خوێنی کوڕەکەی ڕەبیعەی کوڕی حارثە ، کە لە بەنوسەعد

شیرەخۆر بوو وهوزەیل کوشتیان ، وڕیبای سەردەمی نەفامی هەمووی بەفیڕۆیە ، ویەکەم ڕیبایەك کە بە فیڕۆی دەدەم ڕیبای عەباسی کوڕی عبدالمطلبە ، وهەمووی بەفیڕۆ چووە ، لـە خودا بترسن دەربارەی ئافرەتان ، چونکە خودا ئێوەی کردووە بە پارێزەر بەسەریانەوە ، وجووتبوونی لـەگەڵیان حەڵاڵ کراوە بۆتان بە حوکمی خودا ، وئێوەش مافتان لـەسەریان هەیە ، کەسێك نەهێننە ماڵـەوە کە ئێوە پێتان ناخۆشبێت بیهێننە ماڵتان ، ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا لـێیان بدەن بەلاَم لـێدانێك دیارییان نەکات ، وئەوانیش مافی بژێوی وپۆشاکیان لـەسەرتانە بۆیان دابین بکەن بە گوێرەی تواناتان ، وشتێکم لـە نێودا بەجێ هێشتوون ، گومڕا نابن ئەگەر دەستی پێوە بگرن کە کتێبەکەی خودایە ، وئێوە پرسیارتان لـێ دەکرێت لـە بارەی منەوە ، ئێوە چی وەلاَم دەدەنەوە ؟ گوتیان : شاهیدی دەدەین کە تۆ پەیامەکەی خودات گەیاند وئەوەی لـەسەرت بوو بەجێت هێنا وئامۆژگاریت کردین ، پەنجەی شایەتمانی سێ جار بۆ ئاسمان بەرز کردەوە وفەرمووی : پەروەردگارا تۆ شاهیدبە ، پەروەردگارا تۆ شاهید بە ، پاشان بانگدرا ، نوێژی نیوەڕۆی کرد ، پاشان قامەتکرا نوێژی عەسری کرد ولـە نێوانیاندا نوێژی نەکرد ، پاشان سەرکەوت بەسەر حوشترەکەیدا هەتاکو

گەیشتە شوێنی تایبەتی وەستان لە عەرەفات وسکی قەصوای نوساند بە بەردەکانی مەیدانەکەوە ، ورێڕەوی پیادەڕۆکان لەبەر دەستیدا بوو ، وڕووی کردە قیبلە ، لەوێ مایەوە هەتاکو خۆرئاوا بوو ، وکەمێك بەسەر زەردی خۆرئاوابووندا تێپەڕی ، ئوسامەی لە پشتی خۆیەوە سوارکرد ، وپێغەمبەری خودا ﷺ ڕەشمەی حوشترەکەی توند کردبوو هەتاکو خەریك بوو سەری حوشترەکە بنوسێنێت بە شوێنی پێی سواربوونەکەیەوە ، وبە دەستی ئاماژەی دەکرد : ئەی خەڵکینە هێوەربن ، هێوەربن ، هەرکاتێك بەسەر تەپۆڵکەیەکدا سەربکەوتایە کەمێك ڕەشمەکەی بۆ شل دەکرد ، هەتا گەیشتە موزدەلیفە ، نوێژی مەغریب وعیشای لەوێ ئەنجامدا بە یەك بانگ ودوو قامەت ، وهیچ نوێژێکی سوننەتی لە نێوانیاندا ئەنجام نەدا ، پاشان ڕاکشا هەتاکو سپێدە دەرچوو ، ونوێژی بەیانی کرد کاتێك سپێدە بە ئاشکرا دەرکەوت وبانگیاندا وقامەتیان کرد ، پاشان سواری قەصوا بوو هەتا گەیشتە المشعر الحرام ، ڕووی کردە قیبلە وپاڕایەوە : (والله أكبر ، ولا إله إلا الله)ی دەگوت وخودای بە تاك وتەنها ڕاگرت ، لەو شوێنە بەردەوام وەستا هەتاکو دونیا زۆر ڕووناك بوویەوە ، پاشان بە ڕێکەوت پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت ،

وفەزڵی کوڕی عەباسی لە دوای خۆیەوە سوار کرد ، کە کوڕێك بوو قژێکی جوانی هەبوو وخۆیشی پێکەوتوو بوو ، کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ بە ڕێکەوت کۆمەڵە ئافرەتێك تێپەڕین ، فەزڵ سەیری دەکردن ، وپێغەمبەری خودا ﷺ دەستی خستە سەر ڕوخساری ڕووی وەرگێڕا بۆ لایەکەی تر ، بەڵام فەزڵ لەو لایەشەوە تێی دەڕوانین دیسان پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی وەرگێڕا ، هەتا گەیشتە "بطن محسر" ، کەمێك خێرا جوولا ، پاشان ڕێگای ناوەندی گرتە پێش کە دەچێتە سەر "الجمرة الكبرى" ، هەتا گەیشتە ئەو جەمرەیەی کە لای درەختەکە بوو ، وحەوت بەردی تێگرت لە ناوجەرگەی شیوەکەوە ، کە هەر بەردێکی بە ئەندازەی دەنکە پاقلەیەك دەبوو ، لەگەڵ هەر هاویشتنێك اللە أکبری دەخوێند ، پاشان بەڕێکەوت بۆ شوێنی سەربڕینی ئاژەڵان ، وشەست وسێ ئاژەڵی بە دەستی خۆی سەربڕی ، وپاشان چەقۆکەی دایە دەستی عەلی رضي الله عنه ئەوەی کە مابوویەوە سەری بڕی ، ولە هەدیەکەی خۆی عەلی رضي الله عنه کرد بە هاوبەش ، وپاشان فەرمانی کرد لە هەر ئاژەڵێك پارچەیەك گۆشت بهێنن ، کردیانە مەنجەڵێکەوە ولە گۆشت وشلەکەیان خوارد ، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ سواری حوشترەکەی بوو وگەڕایەوە بۆ

کەعبە ، ونوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد ، وچوو بۆ لای نەوەکانی عبدالمطلب ئاوی زەمزەمیان دەدا بە خەڵك ، وفەرمووی : ئاو هەڵبگۆزن ئەی نەوەکانی عبدالمطلب ، ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبووایە خەڵك هورووژم بکەن بەسەرتاندا وبکەون بە سەرتاندا لە کاتی ئاو پێداندا ، یارمەتیم دەدان وئاوم لەگەڵدا هەڵدەگۆزین ، پەرداخێك ئاویان پێدا لێی خواردەوە .

ئەم فەرموودە مەزنە کردار وگوفتارەکانی حەج دیاری دەکات ، وبنەمایە بۆ زۆرێك لە حوکمەکانی ئاین وفەرمانەکانی باوەڕ ، پێویستە هەموو فێرخوازێکی زانستی دروست لەبەری بکات ، ودووبارەی بکاتەوە ولە ماناکەی تێبگات ، وکرداری پێ بکات ، پشتیوان بە خودا .

پ٦٧: ژمارەی غەزاکانی پێغەمبەری خودا ﷺ چەند غەزا بوون ؟.

و: بریتیین لە بیست وحەوت غەزا ، یەکەمیان : الأبواء یە ، وبواط ، وعوشەیر ، وبەدری یەکەم ، وبەدری گەورە ، والکدر ، والسویق ، وعطفان ، وأمرّ ، وبحران ، وئوحود ، وحمراء الأسد ، وبەنو النضیر ، وذات الرقاع ، وبەدری کۆتایی ، ودومە الجندل ، وخەندەق ، وبنو لحیان ، وذوقرد ، وبنوالمصطلق ، وحودەیبیە ، وخەیبەر ، وعومرەی قەزا ،

وفەتحى مەككە ، وحونەين ، وتائيف ، وتەبوك ، ولە پێشدا باسى ناكۆكى پاش وپێشى هەندێك لەم غەزايانە كرا ، وهەر زانايەك پەيماننامەى حودەيبيە وعومرەى قەزا بە غەزا دانانێن ، لاى ئەوان ژمارەى غەزاكان بيست وپێنج غەزايە .

پ٦٨: لە چەند لەم غەزايانە پێغەمبەرى خودا ﷺ جەنگاوە ؟.

و: پێغەمبەرى خودا ﷺ لە نۆ لەو غەزايانە جەنگاوە ، لە بەدرى گەورە ، وئوحود ، خەندەق ، وقوريظة ، وبنوالمصطلق ، وخەيبەر ، وفەتحى مەككە ، وحونەين ، وتائيف .

پ٦٩: ژمارەى نێردراو وتيپە جەنگييەكانى چەند بوون ؟.

و: نێردراو وتيپە جەنگييەكانى پێغەمبەرى خودا ﷺ سى وهەشت نێردراو وتيپى جەنگى بوون ، وپێشتر باسى هەموويان كرا لەگەڵ ديارى كردنى ئەو ساڵانەى كە تێيدا ڕوويانداوە ، جگە لە تيپى ئوسامەى كوڕى زەيد رضي الله عنهما بۆ دەورووبەرى بەلقاء كە لە ساڵى يازدەمى كۆچيدا بووە .

پ٧٠: ژمارەى نوسراوەكانى بۆ پادشاكان چەند نوسراو بوون ؟.

و: ئەوەی کە جێگیر بووە نوسراوەکەیەتی بۆ هیرقلی گەورەی ڕۆمەکان ، وبۆ کیسرا ، ونەجاشی ، وئەوەی ئاشکرایە کە ئەصحەمە بووە ، ونوسراوەکەی بۆ مقۆقسی پادشای میسر ، وبۆ مونزری کوڕی ساوی ، وبۆ هەردوو پادشاکەی عومان ، وبۆ کاربەدەستی یەمامە ، وبۆ هوزەی کوڕی عەلی ، وبۆ حارثی کوڕی شمری غەسانی ، وبۆ موسەلیمە ، ئەم نوسراوانە پێشتر لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە بەدەستیاندا نێردرابوون باسکرا جگە لەوەی بۆ موسەیلەمە نێردراوە ، کە بە ئەو شاندەدا بۆی نارد کە موسەیلەمە ڕەوانەی کردبوون ، چونکە وەڵامی نوسراوی ئەو بوو .

پ٧١: باسی کاربەدەستەکانی بکە لەسەر سامانی خێر وزەکات ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ موهاجری کوڕی ئەبوئومەیەی نارد بۆ صەنعا ، وئەسوەدی عەنسی لێی دەرچوو کە لەکاتەدا لە شارەکە بوو ، وهەروەها بەرپرسی بەنوئەسەد بوو ، ومالکی کوڕی نوەیرە بەرپرسی کۆکردنەوەی خێر وزەکاتی بەنوحەنزەڵە بوو ، وکۆکردنەوەی زەکاتی بەنوسەعدی دابەش کرد لە نێوان زبرقانی کوڕی بەدر ، وقەیسی کوڕی عاصم هەریەك لە لایەکەوە ، وعەلای حەزرەمی لەسەر بەحرەین بەرپرس بوو ، وعەلی کوڕی ئەبوتالب لەسەر ئەهلی نەجران ، بۆ ئەوەی خێر وزەکات کۆ بکاتەوە وسەرانەیان لێ وەربگرێت .

**پ٧٢: کام سورەت لە قورئان کۆتا سورەتە کە بە تەواوی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزیوە ؟.**

**عبداللەی کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت : کۆتا سورەتێك کە لە قورئان دابەزیوە سورەتی المائده ، و﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ە ، وعائیشەی دایکی باوەڕداران رضي الله عنها هاوشێوەی ئەو دەڵێت : سورەتی المائدەیە ، وئیبن عەباس رضي الله عنهما هاوشێوەی ئەو دەڵێت : ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ە ، وبەرائی کوڕی عازب رضي الله عنهما دەڵێت :کۆتا سورەت سورەتی تەوبە دابەزیوە.**

**پ٧٣: کام ئایەت لە کۆتا ئایەتەکان دابەزیوە ؟.**

**و: بەرائی کوڕی عازب رضي الله عنهما دەڵێت : ئایەتی کەلالـەیە[٥]، وعومەر رضي الله عنه دەڵێت : ئایەتی ڕیبایە[٦]، وئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت کۆتا ئایەت**

---

(٥). مەبەست ئەم ئایەتەیە : ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ١٧٦﴾(النِّسَاءِ) .

(٦). مەبەستی ئەم ئایەتەیە : ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٧٥﴾(البَقَرَة) .

که دابەزیوە ئایەتی : ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ٢٨١﴾(البَقَرَة)یە ، وئەبوسەعیدیش رضي الله عنه هەمان بۆچوونی هەیە ، وئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : لە نێوان دابەزینی ئەم ئایەتە ووەفاتی پێغەمبەری خودا ﷺ سی ویەك ڕۆژ بووە ، وسەعیدی کوڕی جوبەیریش دەڵێت : ئەم ئایەتە کۆتا ئایەتە ، ودەڵێت : دوای دابەزینی پێغەمبەری خودا ﷺ نۆ ڕۆژ ژیاوە ، وپاشان لە شەوی دووشەممە کە دوو ڕۆژ لە مانگی ڕەبیعی یەکەم ڕۆیشتبوو وەفاتی کرد .

ولەوانەیە ئەم ئایەتانە لە سەرەتای ئایەتی ڕیباوە هەتا کۆتایی قەرز پێکەوە بە یەکجار دابەزیبن(٧) ، وخودا زاناترە .

**پ٧٤**: کەی پێغەمبەری خودا ﷺ وەفاتی کرد ؟.

**و**: پێغەمبەری خودا ﷺ لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی یازدەیەمی کۆچی لە تەمەنی شەست وسێ ساڵیدا وەفاتی کرد .

**پ٧٥**: کەی ئەو نەخۆشییەی کە تێیدا وەفاتی کرد ، قورس بوو لەسەری؟.

---

(٧). بریتییە لە ئایەتی : ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ ٢٧٥﴾ هەتاکو ئایەتی : ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٢٨٢﴾(البَقَرَة) .

و: لە ڕۆژی پێنج شەممە نەخۆشییەکەی قورس بوو لەسەری ، ولە ڕۆژی دوو شەممە وەفاتی کرد ، وڕۆژی سێ شەممە ئامادە کرا بۆ ناشتن ولە گۆڕنان.

پ٧٦: کێی کردە جێگرەوەی خۆی بۆ ئەوەی نوێژ بە خەڵك بکات لەو نەخۆشییەی کە وەفاتی کرد ؟.

و: ئەبوبەکری صدیقی رضي الله عنه ڕاسپارد کە هاوەڵی ئەشکەوت ، وهاوڕێی سەفەر وشاری بوو ، ویەکەم کەس بوو کە باوەڕی بە پەیامەکەی هێنا ، وملکەچ وگوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە بوو کە لە خوداوە سبحانه وتعالى هێنای ، وبووە جێنیشینی دوای وەفاتی .

پ٧٧: کاتێك وەفاتی کرد چەند هاوسەری هەبوو ؟.

و: پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم کاتێك وەفاتی کرد نۆ هاوسەری هەبوو کە ئەمانەن : عائیشەی کچی ئەبوبەکر ، وحەفصەی کچی عومەر ، وئوم حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان ، وئوم سەلەمەی کچی ئەبوئومەیە ، وسەودەی کچی زەمعە ، وزینەبی کچی جەحش ، ومەیمونەی کچی حارث ، وجوەیرییەی کچی حارث ، وصەفییەی کچی حویەیی ، وخەدیجە پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە وەفاتی کرد ، وزەینەبی کچی خوزەیمە پێش

وەفاتی پێغەمبەری خودا ﷺ وەفاتی کرد ، وپێی دەگوترا : دایکی دەستکورتان .

پ٧٨: چەند منداڵی هەبوو ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ سێ کوڕی هەبوو : القاسم ، کە الطیب والطاهریشی پێ دەگوترێت ، وکونییەکەی بە ناوی ئەو کوڕەوە بوو "أبوالقاسم" ، وعبدالله وئیبراهیم ، وچوار کچی هەبوو ، فاتمە وزەینەب وروقییە وئوم کلثوم ، وهەموو منداڵەکانی لە خەدیجە بوون ، جگە لە ئیبراهیم ، وهەموویان پێش خۆی وەفاتیان کرد جگە لە فاتمە کە شەش مانگ دوای خۆی وەفاتی کرد .

پ٧٩: ئایا پێغەمبەری خودا ﷺ هیچی بە میرات لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە ؟.

و: پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران هیچ لە دوای خۆمان بە میرات بەجێ ناهێڵین ، ئەوەی لێمان بەجێ دەمێنێت دەبێتە خێر وچاکە ؛ بەڵکو زانستی بە میرات لێ بەجێ ماوە ، هەرکەسێك دەستی پێوە بگرێت ، ئەوە بەشێکی زۆری لە میراتی پێغەمبەری خودا ﷺ دەستکەوتووە .

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکان

